**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

# إنّما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق

- ➢ **زەوق و سەلیقە.**
- ➢ **ئەندازیار عوسمان .**
- ➢ **ئەم بابەتە بریتیە لەنامیلکەی (الذوق سلوك الروح )ی بانگخوازی ناسراوی میسری (عباس السيسي) لەگەڵ هەندێ ئەزموونی لای خۆمان !**

چاپخانەی شارستان

بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمد لله رب العالمين، و الصلاة و السلام على رسول الله صلى الله عليه و سلم و وآله و صحبه ومن اتبعه إلى يوم الدين**

**لە نەخۆشخانەی (HCG) لە هندستان کەوتبوم، شەو بوو کاتژمێر دوو نیوی شەو، واتە ئێمە لە قوڵایی خەودا بوین، تەلەفۆنێکمان بۆهات، هاوەڵەکەم وەڵامی دایەوە، هاورێیەکم بوو لە ئەڵمانیاوە، بێگومان کاتەکە زۆر ناوەخت بوو، ڕاستە ئەم دوو نیوەی شەوی لای ئێمە، (١٠)ی شەو بوو لە ئەڵمانیا، بەڵام ئەم هاورێیەم تێبینی ئەم جیاوازی کاتەی نەکردبوو، تێبینی ئەوەی نەکردبوو، ئەمە هێندەی میزاج تێکدان و بێزارکردنە، هێندە خۆشەویستی و هەواڵپرسین نییە، ئەم ڕووداوە، هانیدام ئەم نامیلکەیە بە چاپ بگەیەنم، دەبێت هەموومان لە پەیوەندییەکانماندا، ئەتەکێت ڕەچاو کەین، بارودۆخی بەرامبەر لەبەرچاوبگرین، دەبێت پەیوەندییەکانمان ڕێز و خۆشەویستی و برایەتی لێبچوڕێ، نەك بێتە هۆکاری ئەزیەتدان و بێزارکردن.**

**سەزدار عەبدولرەحمن**
**پرۆژەی باشترین هاوڕێ**

## پێشەکی:

عەباس سیسی دەڵێت:هەر پەڕاوێك چیرۆکێکی هەیە ، چیرۆکی ئەم نامیلکەیەش ئەوەیە : ڕۆژێك لە نووسینگەکەی خۆم دانیشتبووم لەگەڵ برایەکدا کە بۆسەردان هاتبوو ،لەو کاتەدا برایەکی تر هات و دەیوویست کە بە تەنها چاوم پێی بکەوێت و باسێکی تایبەتی هەبوو , منیش ناچار ڕوخسەتم خواست لەمیوانەکەو لەژوورێکی تر قسەمان کردو , تۆزێ زۆری پێچوو، کە هاتمەوە ژوورەکەی خۆم برادەرە میوانەکە گلەیی کرد کەبۆچی زۆرم پێچووەو ماوەیەکی زۆر بەجێم هێشتووە

منیش پێم وت تۆ وادەزانی من ناهەقیم کردوووە بەرامبەرت ؟ وتی بەڵێ ، منیش وتم دەبا بۆت ڕوون بکەمەوە , برا گیان هەق وابوو تۆبچیتە دەرەوەو بوار بدەیت بەوکەسەی کە تازە هاتووەو کاری تایبەتی هەیە , کەی ڕەوایە من ژوورو مێزەکەی خۆم بەجێ بهێڵم وئنجا تۆش گلەیی بکەیت ؟! ئەی کەواتە نووسینگەی چیم داناوە، بەڕاستی ئەم ڕەفتارومامەڵە ناڕەوایانە وادەکەن کە دڵی برایەك گەرد بگرێ.

ئەم جۆرە بێ سەلیقەیی و بێ زەوقیە دەمێنێتەوە ئەگەر چارەسەر نەکرێت و ڕێنمایی پێویست دانەبەزێنرێ بۆ برایان



دیارە ڕێنماییکردن و ئامۆژگاری لەم چەشنە باشتروایە ڕاستەوخۆ نەبێت و بەجۆرێك بکرێت کە بەرامبەر دڵگران نەبێت و سەرشێت نەبێت

حەزرەت ﷺ ئامۆژگارییەکانی زۆربەی بەم جۆرە بوون و کە دەیوویست ئامۆژگاری کۆمەڵێك بکات دەیفەرموو ( **ما بال أقوام یفعلون کذا وکذا**) ئەوە چیانە کۆمەڵێك ئاواو ئاوا دەکەن!.

پێشەوا بەنناش بەقوتابیانی دەڵێت ( **یاأخي لتکن نصیحتك لاخیك تلمیحا لاتصریحاً وتصحیحاً لاتجریحاً**)

واتە: برام بائامۆژگاریەکەت بۆبراکەت بەناڕاستەوخۆ بێت نەك ڕاستەوخۆو ڕاستکەرەوە بێت نەك بریندارکەر.

دیارە هەموو ئەمانەش بەشێکن لە ڕەوشت بەرزی کەحەزرەت ﷺ هاتووە بۆتەواوکردن و گەیاندنی هەروەك دەفەرموێت (**إنّما بُعثتُ لاتممَ مکارمَ الاخلاق**)..

ئاشکرایە ئەوەی زیاتر ڕەوشتی بەرزو جوان بێت زیاتر لەحەزرەتەوە ﷺ نزیك دەبێت لەقیامەتدا هەروەك دەفەرموێت: (إن أقربکم مني مجالس یوم القیامة أحاسنکم اخلاقاً الموطأون أکنافا الذین یألفون ویُؤلفون)..

واتە : نزیکترینتان لەمنەوە ڕۆژی قیامەت ئەوانەتانن کەڕەوشتیان بەرزەو لەخزمەتی خەڵکیدان و خۆیان دەگونجێنن

## گرنگی دانی قورئان بەم مەسەلەیە

ئاشکرایە قورئان پەڕاوی ڕێنمایی و هیدایەتەو کارێکی مەزنی لەئەستۆدایە بۆپەروەردەکردنی ئومەتێکی بێ وێنە , بەشێك لەو پەروەردەیەش لە قورئاندا دەبینین جەخت کردنەسەر ڕەوشت و هەڵس و کەوتە .

١) ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنْكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنْكُمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ مِنْ قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُمْ مِنَ الظَّهِيرَةِ وَمِنْ بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ ثَلَاثُ عَوْرَاتٍ لَكُمْ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ طَوَّافُونَ عَلَيْكُمْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ(٥٨))النور.

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە , بابەندە و ئەو منالآنەتان کە هێشتا نەگەیشتونەتە تەمەنی هەرزەکاری لە سێ کاتدا (فێری ئەوە بکرێن)مۆڵەت بخوازن , لەسەردانی ژووری نووستنی دایك و باوکدا , پێش نوێژی بەیانی , کاتی نیوەڕۆ کەخۆتان دەگۆڕن بۆحەوانەوە , لەدوای نوێژی خەوتنان , سێ کاتەکە لەوانەیە عەورەتی تیادەربکەوێت , لەدوای ئەوسێ کاتە قەیناکات بۆئێوەش و بۆئەوانیش کەبچن بۆلای یەکتری ، ئابەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆڕوون دەکاتەوە، (تامنالەکانتان تووشی کێشەی



دەروونی نەبن )خواش هەمیشە زاناودانایە ( بەوەی کە دەبێتە مایەی خێرو خۆشیتان )..
(وَإِذَا بَلَغَ الْأَطْفَالُ مِنْكُمُ الْحُلُمَ فَلْيَسْتَأْذِنُوا كَمَا اسْتَأْذَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٥٩))النور.

واتە:هەرکاتێك منالەکانتان بالغ بوون , بائەوانیش مۆڵەت بخوازن ، وەکو چۆن کەسانی پێش ئەمان مۆڵەتیان خواست ، لەکاتی هاتوچۆکردنی ژووری دایك و باوکدا ، ئابەوشێوەیە خوا ئایەتەکانیخۆیتان بۆڕوون دەکاتەوەو خوا زاناو دانایە بە بەرژەوەندیەکانتان.
کەئەم ئایەتە هاتە خوارەوە هاوەڵێك لای سەیر بوو هاتە خزمەت حەزرەت ﷺو وتی : چۆن من ڕوخسەت بخوازم بۆچوون بۆلای دایکم ؟ ئەویش فەرمووی : حەزدەکەی لەپڕ بچیتە ژوورەوە لەکاتێکدا دایکت خۆی دەگۆڕێ و بەبێجل بیبینی ؟!
وتی : نەخێر . فەرمووی : دەکەواتە ڕوخسەت بخوازە!

٢) قورئان پەروەردەی موسڵمانان دەکات کەچۆن بچنە ماڵی حەزرەت و دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانْتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي

مِنْكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَنْ تَنْكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِنْ بَعْدِهِ أَبَدًا إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيمًا (٥٣)) **الاحزاب** .

**واتە /ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە مەچن بۆسەردانی ماڵەکانی پێغەمبەر مەگەر مۆڵەتتان بدرێت و مۆڵەت بخوازن ، ئەگەر مۆڵەت دران بۆنان خواردنێک چاوەڕێی پێگەیشتنی مەکەن ئەگەر پێ نەگەیشتبوو (واتە زوو مەچن و بەزۆر خۆتان دامەکوتن) بەڵام کاتێک بانگکران , ئەوە بچنە ژوورەوە ، جاکاتێک نانتان خوارد بڵاوەی لێ بکەن و مەکەونە قسەوباس ، چونکە بەڕاستی ئەو کارەتان پێغەمبەر ئازار دەدات ، ئەویش شەرمتان لێ دەکات (داوای ڕۆیشتننتان لێ ناکات )، خواش شەرم لەڕاگەیاندنی هەق ناکات ، کاتێکیش داوای کەلوپەلێکتان کرد لەخێزانەکانی پێغەمبەر ، لەپشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن ، ئائەو جۆرە ڕەفتارە چاکترو پاکترە بۆدڵی ئێوەو ئەوانیش , بێگومان هیچ کات بۆتان نیە ئازاری دڵی پێغەمبەر بدەن و ، هەرگیز بۆتان نیە هاوسەرانی دوای خۆی بەهیچ جۆرێک مارەبکەن ، چونکە بێگومان ئەوکارەتان لای خوا زۆر**



**گەورەو نابەجێیە (ئەو هاوسەرانەی دایکتانن و دایکیش حەرامە لەکوڕی).**

٣)( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا فِي الْمَجَالِسِ فَافْسَحُوا يَفْسَحِ اللَّهُ لَكُمْ وَإِذَا قِيلَ انْشُزُوا فَانْشُزُوا يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (١١)) **المجادله** .

**واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک لەدانیشتن و کۆبوونەوە کاندا پێتان دەوترێت : ڕێ بدەن بەکەسانی ترو ئەڵقەی دانیشتنەکە فراوان بکەن ، ئەوە ئێوەش فراوانی بکەن ، ئەگەر ئێوە واتان کرد خوا پاداشتی فراوانتان پێدەبەخشێت ، کاتێکیش پێتان دەوترێت جێگە چۆڵ بکەن بۆ پیاوماقووڵ و ڕیش سپی و گەورەکانتان ئەوە جێگە چۆڵ بکەن ، جائەگەر واتان کرد خوای گەورە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە لە ئێوەو ئەوانەشتان زانست و زانیاریان پێدراوە چەندە هاپلەو پایە بەرزیان دەکاتەوە , خواش ئاگادارە بەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن .**

٤)( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَاجَيْتُمُ الرَّسُولَ فَقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَةً ذَلِكَ خَيْرٌ لَكُمْ وَأَطْهَرُ فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (١٢) أَأَشْفَقْتُمْ أَنْ تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيْ نَجْوَاكُمْ صَدَقَاتٍ فَإِذْ لَمْ تَفْعَلُوا وَتَابَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ فَأَقِيمُوا

الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ (١٣)) **المجادلة**

**واته : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێك ویستتان چپەیەك یان قسەیەکی نهێنی لەگەڵ پێغەمبەردا بکەن , پێش ئەو کارە خێرێك بکەن (بەگوێرەی توانا شتێك ببەخشن بەهەژاران ), ئەوە چاکترە بۆتان و خاوێن ترە , خۆئەگەر نەتان بوو , ئەوە چاك بزانن کەخوا لێخۆشبووی میهرەبانە .**

**ئایا دەترسان لەهەژاری پێش ئەوەی کەبەنهێنی و بەتەنها قسەی لەگەڵ بکەن , خێرو چاکەیەك ئەنجام بدەن ؟! چاکاتێکیش کە نەتانکرد خوا لێتان خۆش بوو , دەئیتر ئێوە نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکات بدەن و فەرمانبەرداریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن , خواش ئاگادارە بەوکارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن .**

**ئەمەش پەروەردەیەك بوو بۆهاوەڵان کەهەریەکەو نەچێ بۆکاری تایبەتی خۆی چەند سەعات کاتی پێغەمبەر بگرێت و سەرقاڵی بکات , واتە ئەگەر ویستی بچێ کاتی بگرێ , (کاتی ئەو کاتی هەموو موسڵمانانە ), بۆیە باخێرێك بکات , دیارە زۆر کەسیش نەیبووە خێر بکات بۆیە نەچووە حەزرەت ﷺ سەرقاڵ بکات .**



# تەلەفون کردن

**تەلەفون نیعمەتێکە لەنیعمەتەکانی خوا لەم سەردەمەداو ڕێی دوورت بۆنزیك دەکاتەوە و کاتت بۆ دەگێڕێتەوە . بەڵام بەداخەوە باش بەکار ناهێنرێت . جاری واهەیە میوانێکت دێت و هەرئەوەندە دەزانی دەست دەداتە تەلەفۆن و دەکەوێتە قسەکردن لەگەڵ نەك دۆستی نزیك و ناوشار بەڵکو دۆست وخزمانی دەرەوەش بەسەردەکاتەوە !**

**جارێك دووبرای وڵاتێکی ترسەردانیان کردم , یەکێکیان مۆڵەتی لێوەرگرتم تەلەفونێك بکات بۆکەس وکاری , بەڵێ تەلەفونێکی دووروودرێژی کردو زۆر موجامەلەی یەکتریان کرد , ئەوانەی ئەم تەلەفونی بۆکردبوون وەیان زانی لەسەرخۆیەتی بۆیە نەیان ئەبڕیەوەو درێژەیان پێ دەدا ، لەکاتێکدا ڕەنگە نیوەی قسەکانیان زیادە بووبێت .**

**ئنجا ئەوی تریان ڕوخسەتی خواست و بەهەمان دەستوور! خۆشتان دەزانن نرخی تەلەفون کردنی (دەولی)بەچەندەو لەسەرمن پارەیەکی باش کەوت !**

**برایەکی تر میوانێکی دێت وتەلەفونەکەی بەکاردەهێنێت , بڕوابکەن ئەوبەستە زمانە مووچەی مانگێکی دا بەتەلەفونەکەی میوانەکەیدا ،ئاخر کەی ئەمە ڕەوایە !**

برایەتی مانای ( استغلال)کردن نییە ؟! مانای ئەوە نیە کە ئەرکێکی زیادە بخەینە سەریەکتری و بەسوپاسێك یان خوا پاداشتت باتەوەیەك لێی دەرچین !

جاری واهەیە میوانێك سەردانی برایەك دەكات و براكەش كارێكی گرنگی هەیەو دەیەوێت دەربچێت , میوانەکە دەڵێت :قەیناکە تۆ بڕۆ بەلای كارەكەتەوە و ئێمە ماڵی خۆمانە و وادانیشتووین ئاخر كەی جائیزە كەخاوەن ماڵ لەوێ نەبوو لەناو ئەوماڵ و مناڵەدا جەنابیان بمێننەوە . یان جاری واهەیە میوانەكە دانیشتووەو تەلەفونێك دەكرێت ، ئەم وەڵام دەداتەوە و ناوی خۆی دەڵێ ؟! ئەمەش تەلەفون كەرەكە سەرسام دەكات ، ئاخۆ ئەمە كێ بێ لەم ماڵە ، لەكاتێكدا چاكتر وایە بڵێ : فەرموو ماڵی فلان كەسەو من میوانم ! یان هەرهەقی نەبێ بەسەر تەلەفونەكەوە !

جاری واهەیە لەنووسینگەیەك دانیشتووی, خاوەنەكەی تەلەفونێكی بۆدەكرێت و بەدەنگێكی نزم وەڵام دەداتەوە ڕەنگە حەزنەكات دانیشتوان تێبگەن , كەچی هی واهەیە گوێ هەڵدەخات و خوا خوایەتی شتێكی گوێ لێ بێ ! كەئەمەش لەگەڵ ڕەوشتی بەرزوعورف وعادەتدا ناگونجێ !



## ئیزعاجیشمان کردن

زۆرجار ئەم وشەیە دەبیستی كەبووە بەباو لەسەردەمی خەڵكی ، داوای لێبوردن دەكەم ئەگەر ئیزعاجم كردبن , دەی برا كەدەزانی كاتەكە ناوەختەو ئیزعاجی دروست دەكەیت بۆتەلەفون دەكەی ؟! برایەك دوای یانزەی شەو تەلەفونی بۆكردم و ئەوقسەیەی كرد ، كەتێم گەیاند بەناسكی كەئەم كاتە ناوەختەوكاتی پشوودانە .

وتی داوای لێبوردن دەكەم .

كەچی پاش ماوەیەك جارێكی تر بەهەمان شێوە تەلەفونی كردەوە , ئەمجارە كە توندتر قسەم لەگەڵ كرد .

وتی : دەسەڵات نیە درەنگ لەئیش دێمەوە ؟!

ئاخر باشە گوناهی من چییە ئەو درەنگ دێتەوەو ئیسراحەتی خۆی دەكات و پاشان بەحسابی خۆی بەسەرم دەكاتەوە ، یان كارێكی هەیەو من ئیزعاج دەكات ؟!

## تەلەفونێك بۆ ئەمریکا

هەواڵم زانی کەبرایەکمان لەئەمریکا تەندروستی خراپەو چۆتە خەستەخانە و لەژێر چاودێری پزیشکدایە , منیش ژمارەی تەلەفونەکەیم وەرگرت و خۆشی خۆشی تەلەفونم بۆکرد , لای ئێمە (لەمیسر )سەعات حەوتی ئێوارە بوو , قسەم لەگەڵ کردو بەگەرمی ئەحواڵم پرسی ؟! برادەرەکەم پرسیاری کرد کەلای ئێمە سەعات چەندە ؟!

وتم : حەوتی ئێوارەیە , ئیتر هیچی‌نەوت !ئنجا تێگەیشتم کەمن هەڵە بووم کەحسابی جیاوازی کاتم نەکردووەو لای ئەوان سەعات دووی شەو بوو ، ئەمە بێجگە لەوەی کە ئەو نەخۆش بوو پێویستی بەپشوودان هەبوو .

## تەلەفونی دوکاندارەکان

جاری واهەیە کەسێك قسە لەگەڵ دوکاندارێکدا دەکات بەتەلەفون و ئەوەندەی درێژ دەکاتەوە کەمایەی ئیزعاجی یە !؟ لەکاتێکدا کە رەنگە کڕیاری زۆر وەستابن کەئەم وەڵامیان بداتەوە !

(ئێستا لە سویدو هەندێ وڵاتی تر بۆت نیە کەموشتەریت لابوو بەتەلەفون قسە بکەیت و نەتپەرژێتە سەر موشتەریەکە).



## سەردان و میوانداری

سەردان و میوانداری سیمای کۆمەڵگای موسڵمانەو, شێوازی سەردان و میوانداریش لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵ لەشەرع دا باسکراوەو ڕێ و شوێنی تایبەتی بۆدانراوە ، کەسانی واهەن سەردان دەکەن لەکاتێکدا کەڕەنگە ئەوماڵە بچنە دەرەوەو نیازی کارێکیان هەبێ,بەمەش سەردانەکە ئەبێتە شتێکی کتوپڕو حساب بۆنەکراو کە ئیحراجی دروست دەکات , لەکاتێکدا زۆر ئاسانە کە بە تەلەفونێك یان هەواڵ ناردنێك مۆڵەت وەرگرن ، ئەمەش مەبەستی قورئانە کەدەفەرموێت :

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ (٢٧))النور

ئەبێ میوانی بڕوادار سنگی فراوان بێت , ئەگەر لەدەرگای داو ڕێی وترا کەماوەیان نیەو ناتوانن لەخزمەتیابن ، ئاسایی بێت لای کە بگەڕێتەوەو سەردانەکەی بخاتە کاتێکی تر , قورئان دەفەرموێت (وَإِنْ قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ (٢٨) )النور / واتە : ئەگەر پێتان وترا بگەڕێنەوە بگەڕێنەوە چونکە ئەوە پاکترەو چاکترە

بۆتان . دیارە دەبێت خاوەن ماڵ حەکیمانە ئەو ئیزن دانە چارە بکات تابەرامبەرەکە دڵی نەیەشێت .

هەروەها لەکاتی لەدەرگادانـدا , سێ جار دەبێت لەدەرگا بدرێت ئەگەر نەیان کردەوە بڕوات .

دەڵێن شێخ عبدالعزیز البشری جبەیەك و عەمامەیەکی لەپشت دەرگای ماڵەوە دانابوو، کەلەدەرگا بدرایە خێرا لەبەری دەکردو گۆچانەکەشی دەگرت بەدەستیەوە , ئنجا دەرگاکەی دەکردەوە ، ئەگەر میوانەکەی بەدڵ بوایە دەیبردە ژوورەوەو دەیووت : سوپاس بۆخوائێستا لەدەرەوە هاتمەوە ! ئەگەر میوانەکەشی بەدڵ نەبوایە دەیووت سوپاس بۆخوا کەئێستا هاتی و بینیمی ، چونکە دەردەچم و مەوعیدم هەیەو ئیتر کابرای میوانی بەڕێدەکرد.

بەڕاستی کەسی واهەیە ، بێ ئیش وبێ کارەو دەیەوێت لای کەسانی تری سەرقاڵ کاتی بەسەر ببات ، دیارە ئەمەش ڕەوا نیە چونکە (کات ژیانە)ویارمەتی براکەت بدە سوود لەکاتەکانی وەربگرێ ..

ڕاستە ئێمە یەکتریمان خۆش دەوێت لەبەرخوا ، بەڵام جاری واهەیە میوان لەسەر میوان دا ئەبارێ و دەبێتە ئیحراجی بۆخاوەن ماڵ لەبەربێ جێگەیی یان هەر هۆیەکی تر , کەچاك وایە ڕەچاوی ئەو بارو دۆخانە بکرێت .



## کێشەو ناڕەحەتی خاوەن ماڵ

جاری واهەیە میوانێك ڕوودەکاتە ماڵێك و ئەوماڵە کێشە یەکیان هەیە ، ئەگەر پێیان وت ، چەند توانی هاوکاریان بکاو ئەگەر وەزعیش تەواونەبوو میوانداری‌یەکەی هەڵگرێ بۆکاتێکی تر و ڕوخسەت بخوازێت !

جارێکیان برایەك خۆیی و کوڕەکەی دەچن بۆسەردانی ماڵی برایەك ، هەست دەکەن بێتاقەت و شپرزن لەبەرئەوەی دووڕۆژبوو یەکێ لەکوڕەکانیان نەگەڕابۆوە . ئیتر ئەم میوانە خوا نەکات دڵخۆشیان بداتەوە یان دوایی ئەحواڵێك بپرسێت ؟! ئاخر برایەتی چۆن وادەبێت ..

## نازانی چی بۆ دانێی

لەمیوانداریدا جاری واهەیە خاوەن ماڵ گیردەخوات ، چونکە هەر یەکەو حەزی لەجۆرێك خواردنە کەئەمەش ئاسان نیە بۆهەمووان دابین بکرێت .

جارێك حەزرەت ﷺ چۆتە ماڵی هاوەڵێکی ئەوەی لەبەردەست بووە سرکەو نان بووە ،خواردوویەتی وکوڵێ سوپاسیشی کردون و فەرموویەتی (نعم الإدامُ الخل ، نعم الإدامُ الخل )(موسلیم).

ئەم فەرموودەیە پەروەردەیە , تاخاوەن ماڵ چی دەتوانێ ئەوە پێشکەش بکات و میوانیش هەرچی بۆدانرا سوپاسگوزار بێت و عەیبی لێ دەرنەهێنێ .

تەنانەت لەفەرموودەیەکی تردا هاتووە (لاتكلفوا للضيف فتبغضوه) خۆتان زۆر بارگران مەکەن بۆمیوان بارقتان لەدڵدا دروست نەبێت وبێزار نەبن .

ئەمە مەسەلەیەکە و ڕێزگرتن و گەرم و گوڕی مەسەلەیەکی ترە ، چونکە ڕێز گرتنی میوان لە ئیمانەوەیە ، خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت ( من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليُكرم ضيفه).



## کەسێك دەعوەت دەکرێ وخەڵکی تردێنێت؟!

جاری واهەیە برایەك دەعوەتی برایەك یان چەند برایەك دەکات و خۆی ئامادە دەکات بۆیان , کەچی کەدێن خەڵکی تریش لەگەڵ خۆیان دێنن کەدەعوەت نەکراون ، دیارە ئەمەش ناخۆشە بۆخاوەن ماڵەکە .

جارێك خۆشەویست و چوار هاوڕێی دەعوەت دەکرێن لەڕێگا هاوەڵێکی تریان پێدەگات و لەگەڵیان دەڕوات ، لەبەر ماڵەکەدا خۆشەویست ﷺ پێی دەفەرموێت : تۆ دەعوەت نەکراوی ,لێرەدا بوەستە تائاگاداریان دەکەین و ڕوخسەتت بۆدەخوازین .

ئنجا خۆشەویست ﷺ بەخاوەن ماڵەکەی فەرموو : برادەرێکیش لەگەڵمان هاتووە ئەگەر ڕێی دەدەی ڕێی بدەو ئەگەرنا بابگەڕێتەوە ,ئەویش وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ڕێی دەدەم بابفەرموێت .

دیارە لەکاتی نان دانانیش دا جوانترە کەهەموان چاوەڕێی فەرمووی خاوەن ماڵ بکەن و دوعای (**اللهم بارك لنا فيما رزقتنا وقنا عذاب النار**)بخوێنن .

## سەردان لەفەرمانبەر

هەندێ سەر لە براکانیان دەدەن لەکاتی دەوامدا کە ئەوکاتە موڵکی خەڵکیەو هەق نیە بەفیڕۆ بدرێت، کەئەمەش ئیحراجی بۆ برا فەرمانبەرەکە دروست دەکات .

## ڕەچاو نەکردنی حاڵی خاوەن ماڵ

برایەك گێڕایەوە کەخۆی و برایەکی و خوشکێکی چوون بۆ قاهیرە بۆ خوازبێنی ئافرەتێك بۆبراکەیان ، بۆئەمەش لەماڵی یەکێ لەناسیاوەکانیان دابەزیبوون کەرۆژی پێشتر ژنی گواستبۆوە . ئەویش ناچار زۆر ڕێزی لێگرتبوون و شەو خزمەتی کردبوون و پاشان ژنەکەشی ناردبوولەگەڵ براکەوخوشکەکەی دا کەئەو ئافرەتەیان بۆ داواکات ؟!

برایەکی تر دەڵێت :خۆم و هاوسەرەکەم و چوار منداڵ لەخانوویەکی سادەدا دەژین و بەیانی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان دۆستێکی کۆنم خۆی کرد بەماڵدا وتی :بیری دۆستایەتیەکەمانم کەوتۆتەوەو حەزم کردووە یەکەم ڕۆژو دووەم ڕۆژی جەژن لەگەڵتان بم .

دیارە ئەمە کارێکی نەشیاوەو خەڵك حەز دەکات لەڕۆژانی جەژن دا ئازاد بێ و کێی بوێ سەردانی بکات.



## سەردانی نەخۆش

باری دەروونی و لاشەیی نەخۆش ئەوە دەخوازێت کە ڕەچاوی بارو وەزعەکەی بکرێت لەسەرداندا ، تائەکرێت سەردانەکە کورت بێت و شتانێك باسبکرێت کەدڵخۆش کەرو دڵدانەوە بێت بۆی .

جاری واش هەیە نەخۆشەکە لەژووری چاودێری دا دانراوە و نابێ سەردانی بکرێت ، کەچی هی واهەیە سوورە لەسەربینینی و سەردانی کەئەمەش وانابێ و تۆ زیانی پێ ئەگەیەنی .

## میوانێکی شەوێکی درەنگ

شەوێکی درەنگ برایەك لەدەرگای داو خۆی ناساند کە لەبیست ساڵ لەمەوبەرەوە دەمناسێت و پاشان باسی کرد کە لەوڵاتێکی عەرەبی دراوسێ فەرمانبەرەو خوا ماڵو سامانێکی باشی داوەتێ و ئەم ساڵیش نیازی حەجی هەیەو ، دەیویست ناونیشانی براکانی بدەمێ لەمەکەو مەدینە ، تالەماوەی حەجدا لەلایان بمێنێتەوە . منیش وتم : ئەوانەی من دەیانناسم ئەمساڵ نیازی حەجیان هەیەو ڕەنگە نەتوانن لەخزمەتتا بن . ئنجا عادەتیش وایە ، حاجی یان دەچێتە ئوتێل یان دەچێتەلای (مطوف)و لەگەڵ حەملەدارەکاندا دەبێت .

# کلیل ونکردن

برایەك کلیلی شوققەیەکی قاهیرە دەدات بەبرایەکی تر کەچەند ڕۆژێك تیا بێت و گەشت وگوزاری خۆی بکات ، میوانی بەڕێزمان کە دەڕواتەوە کلیلەکەش دەبات لەگەڵ خۆی دا و پاش چەند هەفتەیەك کلیلەکە دەساو دەس دەنێرێتەوە و سەرەنجام ون دەبێت ؟!

# سەردانێك بۆ فەڕەنسا

داوام لێکرا کەسەردانی هەندێ برا بکەم لە فەڕەنساو، مەوعیدی سەردانەکەو شەمەندەفەر دیاری کراو، لە بەرئەوەی منیش برادەرەکانم نەبینیبوو , بۆیە شوێنێکیان بۆدیاری کردم کەلێی چاوەڕێ بکەم و برایەك بێت بۆلام . کاتێ من گەیشتم کەسم نەبینی و زیاتر لەسەعات و نیوێك چاوەڕێم کردو زۆر خەیاڵاتم بۆ هات ، ئەگەر ئەڕۆم نابێ ، ئەگەر ناڕۆم کێ دەڵێ دێت .
سەرەنجام برایەك هات و وتم بۆدوا کەوتی , وتی : لەمزگەوتێکی دوور نوێژی جومعەم کرد , منیش لەگەڵ ئەو هەموو تووڕەیی و بێ تاقەتیەدا وتم : جابرا یەکێکیان بناردایە کەنوێژ نەکات ؟! ئەویش پێکەنی و، ناچار بووم کە خاوببمەوە و قسەنەکەم !



ئنجا بردیانم بۆمەرکزی ئیسلامی لەوێ کەتازە نۆژەن دەکرایەوە , نیازیان بوو لەژوورێکی ساردو سڕو ڕەق وتەق دا دامنێن , منیش ناچار چوومە ئوتێل .

# حەج و شت ڕاسپاردن

کاتی خۆی کەسێك دەچوو بۆحەج ، دیاری دەهێنا کە سیواك یان کلاو یان ئاوی زەمزەم بوو ، بەڵام حاجی واهەیە لەبەرقسەی خەڵك باری خۆی قورس دەکات و دەیەوێ خەڵکی لەخۆی ڕازی بکات کەئەمەش زۆر زەحمەتە.
هەروەها کاتێك یەکێك دەچێت بۆحەج هەندێ کەس ڕایدەسپێرن بۆ شت , تەنانەت ئەگەر پارەکەشی بدەنەوە ، مایەی ناڕەحەتی و بارقورسی یە بۆحاجی ، ئەگەر نەشیهێنێ ئەوا گلەیی زۆری لێ دەکرێت .
لەحەج مرۆۋ گیر دەخوات بەدەست جانتاو کەل و پەلەکانیەوە ، ڕۆژێك لەئوتێل لەمەدینە ژنێك داوای لێکردم کەجانتاکەی کەزۆر قورس بوو بۆی بەرمە قاتی سەرەوە ، کە دەستم دایە بەڕاستی هەرچەند هەنگاوێك بوو ، دام ناو زۆر ئازاری دام ، بەجۆرێك کەچەند ڕۆژ لەخەستەخانەی مەدینە بۆی کەوتم و حەجی ئەو ساڵەم لەکیس چوو !

# لەڕووا داماندا

هەندێ هاوەڵ لەپاص دا یەکێ پێش دەخەن, تالەڕوودا دابمێنێ و پارەی هەموویان بدات , دیارە ئەمەش جۆرە ئیحراجیەکی تیایەو دوورە لەڕەوشتی بەرزەوە .
یان هەیە لەسەرە گرتن دا فێڵ دەکات و خۆی دەباتە پێشەوە و , هەقی کەسانێکی تر دەخوات و ڕەنگە هەموو کەسیش لەڕووی نەیەت قسەبکات !

## خۆ عیادەنیە ؟!

زۆرجار پزیشکی برادەرم سەردانم دەکەن لەڕۆژانی پشوویاندا , جاهەرئەوەندەی میوانی تر دێن و دەزانن کەپزیشکە ، دەکەونە باسی نەخۆشیەکانیان و دەیانەوێت دەرزی و دەرمانیان بۆبنوسێ , دکتۆریش لەڕوودا دائەمێنێ و نازانێ چی لێ بکات , دیارە دەرمان نووسین پێویستی بەپشکنینەو لەعیادە و نەخۆشخانەدا دەکرێ نەك لەنوسینگەکەی مندا .



# خەوگێڕانەوە

ناسیاوێك ڕۆژێك پەیوەندی پێوە کردم و وتی : خەوێکم پێتەوە دیوەو حەزدەکەم بۆت بگێڕمەوە , منیش لەماڵەوە چاوەڕێم کرد تاهات و کەوتە خەوگێڕانەوەو وتی : (لەخەوما وەك پێش بەیانی بێت , خەڵکێکی زۆرم بینی کە (لاإلە إلا الله محمد رسول الله)یان دەوت و کەپرسیارم کرد وتیان (حاج عباس سیسی)مردووە).
ئنجا سەیریشم دەکات بزانێ کاریگەری خەوەکە لەسەرم چەندە ؟!
منیش پێم وت : برا دەڵێن مردن لەخەودا مانای تەمەن درێژی یە و سوپاسم کرد و ڕۆیشت ؟!
ئاخرئەم خەوە چ پێویستە بۆم بگێڕیتەوە و کاتم لێ بگرێت , مەگەر خۆشەویست ﷺ نافەرموێت هەموو خەوێك مەگێڕنەوە.
ڕۆژێك کابرایەك خەوێکی گێڕایەوە , گوایە لەخەویا سەری لێ بۆتەوەو سەرەو خوار خلۆر بۆتەوەو خۆشی بەدوایا ڕای کردووە , خۆشەویست ﷺ فەرمووی : کەسێ شەیتان یاری پێدەکات بانەیگێڕێتەوە !

# پێڵاو داکەنن لەماڵان

ئاشکرایە ئیسلام ئاینی پاك و تەمیزییە ، قورئان دەفەرموێت :

(إن الله يحب التوابين ويحب المتطهرين)البقره /٢٢٢ ..

بۆیە هەقە هەموو موسڵمانێ ڕەچاوی پاك وتەمییزی بکات لەهەموو شتێکدا ، یەکێ لەمەسەلەکانی پاك وتەمییزی داکەندنی پێڵاوە لەکاتی چوونە ماڵاندا ، کەچی هەندێ کەس فیزیان نایهێنێ پێڵاوەکانیان دابکەنن کەئەمەش بۆخۆی ناڕەحەتیەك بۆخاوەن ماڵ دروستدەکات .

یان هی واهەیە گۆرەویەکانی بەتایبەت لەهاویندا بۆنی ناخۆشەو خەڵکی پێی ناڕەحەت دەبن ، کەئەمەش لەسوننەتی خۆشەویستەوە ﷺ دوورە کەهەمیشە پاك و تەمیزو بۆن خۆش بووە .



# لێخوڕینی ئوتومبیل

ئوتومبیل نیعمەتێکەو قەدر زانینی ئەو نیعمەتەش بەوە دەبێت کە سوپاسی خوای لەسەربکەین و خەڵکی پێ ئازار نەدەین , ئاشکرایە یاساکانی مرور بۆسەلامەتی خەڵکیەو لەبەرژەوەندی هەمواندایەو , ئوتومبیل لێخوڕینیش زەوق و سەلیقە وڕەوشتە .

هی واهەیە چیکلانەی بچوکەو ئەکەوێتە هۆڕن لێدان و خەڵك ناڕەحەت کردن , یان کەدەچێ بەدوای کەسێك دا لەبەردەرگاوە بەهۆڕن ئاگاداری دەکات و بانگی دەکات کە دەرو دراوسێ هەراسان دەبن .

هی واهەیە پاك و تەمییزی ناو ئوتومبیل و پاص ناپارێزێ و بەهەقی خۆی دەزانێ هەرچی بکات !

هی واش هەیە لەپەنجەرەوە شت فڕێ دەداتە دەرەوەو شەقامەکان پیس دەکات و ئوتومبیلەکانی دوای خۆی بێزار دەکات , کە لە هەندێ ولاتدا پێ‌ی بزانن سزا دەدرێت و (غەرامەیان) لێ دەسەنرێ .

## وتاردان

جاری واهەیە کە برایەك وتاربێژێك دەناسێنێ بەئامادەبووان بەچاکی پێشکەشی ناکات و هەقی خۆی ناداتێ ، یان جاری واهەیە زیاد لەهەقی خۆی شیعرو شانامەی بەسەردا هەڵدەدات .

وتاربێژی واش هەیە ، ئەوەندە خاوە ئامادەبوان خەولێدەخات ، یان ئەوەندە دەنگی بەرزو پەلەیە ، گوێگران مێشکیان دەچێت .

هی واش هەیە ، ناوبەناو دەڵێ : نامەوێ وتارەکەم درێژبکەمەوەو سەرتان بێشێنم . کەچی هەر لەسەری دەڕواو پابەند نابێت بەوکاتەوە کەبۆی دانراوە .

کاتێکیش وتاربێژێك تەواو دەبێت ، جاری واهەیە برایەك بەقسەوە دەیگرێت و نایەڵێ کەسانی تر سڵاوی لێبکەن و بیناسن ، کە ئەمەش دوورە لەزەوق وسەلیقەی بڕوادارەوە .



## هەڵسو کەوتی ناو مزگەوت

خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت کە بۆ نوێژی جومعە خۆمان بشۆین و بۆن لەخۆمان بدەین و, ئەگەر پیازو سیرمان خواردبوو نەچین بۆ نوێژی جەماعەت تا ئازاری خەڵکی نەدەین .

هی واهەیە بەجلی ئیش وعەرەقاوی و بۆنی ناخۆشەوە مزگەوت بۆن ناخۆش دەکات , لەکاتێکدا لەخوارووی ئەفریقیا سەلیقەیان بەکارهێناوە وچەند دەست جلی پاکیان هەڵواسیوە و هەرچی کە ویستی بچێتە ژوورەوە ئەوجلە پاکانە (کەوەك دزداشەن)لەبەردەکاو دوای نوێژەکە هەڵی دەواسێتەوە بەشوێنی خۆی داو ,سەرپەرشتیاری مزگەوتیش ناوبەناو جلەکان دەشواو ئوتوی دەکات تاهەمیشە پاك و بۆن خۆش بن .

لە دانیشتن بۆنوێژدا , هی واهەیە لەدواوە دادەنیشێ و خەڵکی دەبێ پێ هەڵهێنن بەسەریا کەئەمەش بۆهەردولا ناخۆشە .

هی واهەیە وەك شوێن بڕابێت , دەچێتە نێوان دووبرادەرەوە کە ڕەنگە حەزبکەن بەیەکەوە بن , لەکاتێکدا خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت ( لايحل لرجل أن يفرق بين اثنين إلا بإذنهما).

وەستان لەڕیزی نوێژدا تائێستا کێشەیەکی گەورەیە لە مزگەوتەکاندا, هی واهەیە سی ساڵە نوێژ دەکات تائێستا نازانێ چۆن لە ڕیزی نوێژدا بوەستێ ؟ !
ئەمە بێجگە لەوەی کە زۆر بەئاسایی بەبەردەم نوێژخوێندا دێن و دەچن و هەروەک هیچ نەبووبێ !
هی واش هەیە لەزستاندا بەپێڵاوی قوڕاوی و چەتری تەڕی بارانـاوی ڕاخەری ناومزگەوت پیس دەکات کەخەڵکی ناوچەوانی دەخەنەسەر بۆخوا !
هەندێ برادەر لەکتێبێکی فیقهیەوە ڕایەك وەردەگرێ لەسەر چۆنیەتی دەست گرتن یان قاچ بڵاوکردنەوە یان دەست بەرز کردنەوە یان پەنجە جوڵاندن لەتەحیاتدا , ئیتر لەمزگەوتدا ئەو ڕایە جێ بەجێ دەکات و پیاوێکی پیری داماویش بەتەنیشتیەوە نوێژ دەکات و سیساڵە دێتە مزگەوت شتی وای نەدیوەو نەبیستووە لەماموستای مزگەوت , بۆیە هەندێ جار بەبەلاش پرتەو بۆڵە دروست دەبێت و هەندێ ماموستاش لەجیاتی ئاوی پیابکات بەنزینی پیادەکات ؟!
دەڵێت: نازانم ئەم گەنجانە ئەم دینەیان لەکوێ هێناوە , لەکاتێکا زۆر ئاسانە بڵێت : ئەمەی ئەم لاوەش ڕاستە و ڕای جیاوازی زانایانی لەسەرەو هەموویان ڕاستن و مرۆڤ ئازادە کامیان جێ بەجێ بکات و ئەوانەش هیچیان روکنی نوێژ نین و هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕن .



## ئیمام

هەندێ ئیمام جاری واهەیە ڕەچاوی باری نوێژ خوێنان ناکەن و ئەوەندە نوێژەکە درێژدەکەنەوە کە دەبنە مایەی بێزاری ئامادە بوان ، لەکاتێکدا کە خۆشەویست ﷺ بە ( معاذ)ی فەرموو : نوێژەکەی درێژ نەکاتەوە لەجەماعەت دا و خەڵکی تووشی فیتنە نەکات .
جاری واهەیە کەسێك نەخۆشە یان لەسەر سەفەرە یان مەوعیدێکی هەیەو ، ئەو نوێژ درێژکردنەوەیە ئازاری دەدات و کاری لێتێك دەدات ، جارێك لەسەر سەفەربووین بۆشارێکی تر بۆ ئاهەنگی ژن هێنانی برایەك ، کەنوێژمان کرد یەکێکیان کرد بەئیمام و پێمان وت ئێمە ئێوارەو عیشا بەیەکەوە دەکەین , ئێوارەمان تەواو کرد و لەنوێژی عیشاکەدا ئیمام بیری چووەوە کە لەسەر سەفەرین و نوێژەکەی درێژ کردەوە تاشەمەندەفەر بەجێی هێشتین و لە سەردانەکەمان دواکەوتین و بووین بەئیحراجی بۆئەومالەی کە بۆی دەچووین ، داماوانە زۆر چاوەڕێیان کردبووین و دڵیان کەوتبووە ناڕەحەتیەوە !

## ئەدەبی قسەکردن

ڕۆژێك مامۆستایەکی یەکێ لەزانکۆکانی ولاّتێکی عەرەبی سەری لیّ دام و باسی یەکیّ لەمامۆستاکانی ئەو زانکۆیە هاتە پێشەوە ، منیش وتم : بەڕێزتان کار دەکەن لەگەڵیان؟ وتی : نەخێر ئەو کاردەکات لەگەڵ مندا ، یەکسەر فریای خۆم کەوتم و وتم : ببورە نەمزانی بەڕێزتان وەزیفەو دەرەجەی عیلمیتان چۆنە ؟
وتی : من مامۆستای ئەوم !

لەگەشتێکدا لەگەڵ کۆمەڵێ لاوداو , پاش یەکتر ناسین و گفتوگۆکردن لەگەڵ یەکێکیاندا ، لاوەکان لەو برادەرەیان پرسی : شێخ عباس سیسی چۆن دەبینیەو بەلاتەوە چۆنە؟ ئەویش بەئەدەبەوە وتی : من چیم باس لەبەڕێزیان بکەم و ڕام هەبێ بەرامبەری ، ئەو هەقە ڕای خۆی دەربڕیّ بەرامبەر من !

جاری واهەیە قوتابیەکی زانکۆ باسی مامۆستایەکی دەکریّ ، کەچی دەڵێ: ئا دەیناسم لەگەڵ من بووە لەزانکۆ ؟! ئاخر تۆ قوتابیەك بوویت و ئەو مامۆستا , چەند جوانترە بڵێی : مامۆستامان بووە لەزانکۆ ؟!

سەیری ئەم ئەدەبە جوانەی عەباسی مامی پێغەمبەر بکەن ﷺ ، کاتیّ لێی پرسرا : تۆ گەورە تری یان پێغەمبەر ﷺ ؟ ئەویش وتی : ئەو گەورەترەو ، من پێش ئەو لە دایك بووم .



## ڕێز گرتن لەزانایان

جارێك پێشەوا بەننا بانگ دەکرێت بۆ ئاهەنگی مارە بڕینی کوڕی زانایەکی گەورەی ئەزهەرو ، لەهەمان کاتدا شێخی ئەزهەریش ئامادە دەبێت ، هەندیّ لە ئەندامانی بنەماڵەکە داوا لەپێشەوا بەننا دەکەن کە کوڕو کچەکە لەیەك مارە بکات , پێشەوا بەنناش داوا لەشێخی ئەزهەر دەکات کەبەو کارە هەستێت و دیارە ئەم ڕێزگرتنەش جێی سوپاس و پێزانینی هەموو لایەك بوو ، ئەوەندەی تر بەننا لەبەرچاوی ئامادە بوان گەورە بوو .

# قسەنەدانەوە لەڕووی خەڵك

هی واهەیە ڕق ئەستوورەو نابوریَ و قسەیەك هەڵدەگریَ ، تاڕۆژێ لەڕۆژان بیداتەوە لەڕووی کەسێك و تەریقی بکاتەوە ..

شێخ (محمد حامد ئەبو النصر)ڕابەری چوارەمی ئیخوان , کاتی خۆی دەعوەتی ئیمام بەننا دەکات بۆشاری (منفلوط)وبەم بۆنەیەوە ئاهەنگێکی گەورە دەگێڕن . شاعیرێك لەئاهەنگەکەدا هۆنراوەیەك پێشکەش دەکات و ئیمام بەننا هەست دەکات یەکیَ لەتەنیشتیەوە لەبەرخۆیەوە هۆنراوەکە دەڵێتەوە , لێی دەپرسیَ : ئایا شاعیرەکە پێشتر هۆنراوەکەی پیشانی بەڕێزتان داوە وادەیزانی و لەبەرتە ؟!

دەڵیَ : نەخێر ، ئەوە هۆنراوەی باپیری (محمد حامد أبوالنصر)ەو کردویەتی بەهی خۆی , ئەبیَ دوایی پیَ ی بڵێم و تەریقی بکەمەوە !

بەنناش تکای لێدەکات کەوازی لیَ بهێنیَ و دەڵیَ : ئەو شاعیرە خۆی ڕەنجاندووەو ویستویەتی ڕێزی ئێمە بگریَ و بەهۆنراوەیەك بەشداری بکات ، چ پێویست دەکات لەزەوقی بدەیت و شەرمەزاری بکەیت ,ئەگەر پیَ ی نەڵێیت و بەدۆستی بمێنێتەوە باشتر نیەلەوەی بیکەی بەدوژمنمان ؟! .



# پەڕاوو گۆڤار

جاری واهەیە کەسێك سەردانت دەکاو دەست دەداتە ئەو پەڕاوو گۆڤارانەی کە لەو ناوەدا دانراوەو دوایی داواش دەکات کەبیانبات بیانخوێنێتەوە , ڕۆژێك برایەك ویستی چەند پەڕاوێك بەرێت ومنیش وتم : جاریَ یەکێکیان بەرەو کە تەواوت کرد وەرە یەکێکی تر بەرە , وتی : ئاخر کاتم نیە , منیش نەم دایەو لەدڵی خۆمدا وتم : ئەی من کاتم لەکویَ بوو ڕاکەم بەدواتا تاکتێبەکانم دەست کەوێتەوە .

برادەری واهەیە ڕێز لەکتێب ناگریَ و بەپیس و پۆخڵی و شڕو شێواوی دەیهێنێتەوە .. ((قەت لەدڵم دەرناچی برادەرێك کتێبی ( مذاهب اسلامیة معاصرة )ی (محمد قطب)ی برد بیخوێنێتەوە کەهێنایەوە دوژمنتان شتی وا ببینیَ !؟ هەمووی پیس کردبوو لەکاتێکدا کتێبەکە گەردی لیَ نەنیشتبوو , هێشتا خۆم نەمخوێندبۆوە , تومەز برادەرەکەم دوکانی فیتەری هەیە ، لەدوکان بەدەستی چەورەوە دەستی داوەتیَ و هەرلەوناوەدا دایناوەو کەهێنایەوە کوڵیَ خەفەتم خواردوو بڕیارم دا ئیتر هیچی نەدەمیَ !.

برادەرێکم ئەوەندە کتێبی خۆش دەویَ ، دەڵیَ : من دڵداری لەگەڵ کتێبەکانمدا دەکەم , دەی کەی ڕەوای هەقە کەسیَ قەدری کتێب نەزانیَ , پەڕاوی ببات و لەزەوقی بدات)) وەرگێڕ .

# دواکەوتن لەمەوعید

هەرکەس بەشی خۆی سەرقاڵی هەیە ، چەند خۆشە کەپابەند بێت بەو مەوعیدەی دیاری دەکرێت , برایەك سەعات هەشتی دیاری کرد کەلەگەڵیا بچم بۆماڵیان , منیش بەیانی سەعات هەشت خۆم ئامادەکردو چاوەڕێم کردبێت و پێکەوە بڕۆین , کەچی تاسەعات دە نەهات، پاشان ئێوارە سەعات هەشت چاوەڕێم کردو وتم : نەك ئێوارەی وتبێ و من نەمزانیبێ ، ئێوارەش نەهات .

هی واهەیە مەوعیدێك دادەنێت کەتیایا دێت بۆنان خواردن چێشت سارد دەبێتەوە و ماڵ شپرز دەبێت هێشتا جەنابیان تەشریفیان نەهێناوە !

جاری واهەیە سەعاتێك دیاری دەکرێت بۆ وتاردانێك , وتارەکە دەست پێدەکات و کەسی واهەیە دوای چارەکێ یان نیوسەعات ئامادە دەبێت و پشێوی لەهۆڵەکەدا دروست دەکات بەکورسی هێنان و بردن وشتی تر !

یان سەد کەس زیاتر ئامادە دەبێت و وتارەکە نیوسەعات یان سەعاتێك دوا دەکەوێت ، کەبەمەش سەد سەعات کاتی بەسوودی ئامادەبووان بەفیڕۆدەڕوات و بێتاقەتی ڕوویان تێدەکات .



# جارێك بینویەتی و تەکلیف دەکات

جاری واهەبوو برایەکم لەگەڵ بووە لەشوێنێك ویەکێکی تر هاتووەو ، یەکسەر داوای لێکردووم کە بە یەکیان بناسێنم , ئنجا کەپێم ناساندوون ، تەنها جارێك دیویەتی و هەرلەوکاتەدا یان کاتی تر هەوڵی داوە کەتەکلیفێکی لێ بکات .

لەخەستەخانەیەك کەخاوەنەکەی دەناسم و ڕێز و خۆشەویستی هەیە لە نێوانماندا ، فەرمانبەرێکی خەستەخانەکە هات بۆلام وای دەرخست کەمن دەناسێ و دۆستمە ، بەمەرجێ من هەر نایناسم . ئنجا ئەیویست بەهۆی ناسیاویەکەی منەوە هەندێ برادەری دابمەزرێنێ و لەوێ وتبووی گوایە من پەسەندم کردون و تکایان بۆدەکەم ! چەندجار ویستبوی کاری لەم جۆرە بکات ، تاباش بوو دەریان کرد ؟!

# زۆر پرسیار نەکردن

لەسەرداندا هی واهەیە پرسیاری هەموو شتێك دەكات , ئەم خانووەتان كەی كڕی ، ئەی ئەم تاقمە بەچەند , لەكوێ كڕیتان , ئەی منالەكانت ، باوك و براو كەس و كارت ،چی دەكەن ؟؟ ..هتد ..

زۆر لەپرسیارەكانیش لەئەنجامی حەسەدو غیرەوەیەو وەلامی ئەدەیتەوە نابێت و وەلامی نادەیتەوە هەرنابێت.

هەروەها لەسەرداندا ئەم لاو ئەو لا ماچ كردن دیاردەیەكی ناخۆشەو خۆزگە هەر نەمایە , یان با وەك هەندێ شوێن باوەش پیاكردن و شان ماچ كردن هەبێت باشترە ! ..

# درێژ كردنەوەی باسێك

برادەرێك هات بۆ لام و كەوتە قسەكردن و هێنانەوەی سەرەمەسەلە ، نیوسەعاتی یەكەم بەچاكی گوێم لێگرت ، لە نیوسەعاتی دووەمدا گرنگی دان و گوێگرتنەكەم بووبەنیوە , لەدوای ئەوەوە بێزار بووم و تاقەتم نەبوو گوێی لێبگرم ، خواخوام بوو نەجاتم بێت تاخوا كردی بانگی نیوەڕۆی داو لە كۆڵم بووەوە.



# دڵناسكی

برایەكی بازرگانمان هەرچەند برایەك بچوایە بۆلای و لە بەركارێك هەستایە بەلایەكدا چەكمەجەی مێزەكەی دادەخست ئنجا دەڕۆیشت ، ئەو برایەش دڵی ناسك بوو ، وەیزانی ئاخۆ لەبەر ئەوە و گوایە بەئەمینی نازانێت .

كە لەڕاستیدا واش نەبوو ، ئاخر باشتر نیە بۆهەردوولا كەئەو چەكمەجەی پارەیە هەروا بەجێ نەهێڵێت !

یان برای واهەیە دڵی ناسكەو هەرشتێك بوترێت دەیباتەوە سەرخۆی دیارە ئەمەش مایەی نەگونجان و دڵ ڕەنجانە بەخۆڕایی !

جاكەدەڵێین بارێز لەكاتی یەكتری بگرین بەتایبەت بەرپرسیار و فەرمانبەران ئەوە لێرەوە سەرچاوە دەگرێ و جۆرێكە لەزەوق و سەلیقەی جوان !

یان ئافرەتێك ماڵ ومێردی هەیەو دەبێ چێشت لێ نێ و ماڵ پاك بكاتەوە وبچێ بەلای منالەكانیەوە , یەكێكی بێكار بچێ چەندسەعات لەكاتی ببات كەی ڕەوایەو كەی هەقە ؟!

## هەرگەسەو بەشی خۆی ئەزموونی هەیە !

دەمی هەرکەس بکەرەوە بەشی خۆی زووخاوی لایە بۆت هەڵڕێژێ :

١-هی واهەیە بەمناڵی هاروهاجەوە دەچێت بۆماڵان و نەخۆی مناڵەکانی دائەنیشێنێ , نەڕازیشە کەخاوەن ماڵ بەمناڵەکەی بڵێ دانیشەو وامەکە .گوایە مناڵەکانی نازدارن و چی دەکەن بابیکەن تائاساری ماڵەکە دەردێنن و یەك دووشت دەشکێنن !

٢-ئێستا تەلەفون هەرزانە , هی واهەیە دراوسێکانی لەوەخت و ناوەختدا هەراسان کردووە !

٣-لە گەڕەکدا هی واهەیە ئاسن و کەل و پەلی دوکانەکەی دادەنێ و هەم دیمەنی ناقولایەو هەم ڕێ دەگرێ ، ئەمە بێجگە لەوەی هی واهەیە لۆری لەکۆلاندا ڕادەگرێ و بەڕاستی دیمەنی ناشرینەو ڕێ دەگرێ و دەنگیشی ناخۆشە .

٤-بەرەڵاکردنی مناڵ لەکۆلان و هاروهاجیان دراوسێ ئیزعاج دەکات و هەموو پێوەی دەناڵێنین , ئەمە بێجگە لەوەی مناڵانیش بێ تەربیەت دەبن !



٥-بێ زەوقی لەتەعزیەدا بەقسەکردن و زەردەخەنەو زۆر دانیشتن ومانەوە بۆنان خواردن و .. هتد . هەموو کەسی بێزار کردووە. ئەمە بێجگە لەقورئانخوێنی دەنگ ناخۆشی نەشارەزاو وەعز خوێنی نەفام کەزۆربەی وتەکانی دین ناشرین دەکات لەبەر چاوی ئامادە بوان .

٦-بێ زەوقی لەهێنانەوەی قەرزدا , تەنانەت وای لێهاتووە , من دەڵێم : دەستت ماچ دەکەن تاقەرزێك دەدەی بەکەسێك ، دوایی ئەبێ قاچی ماچ بکەی تائەتداتەوە ! .

## بەنوێژ و ڕۆژووی كەس مەخەڵەتێ !

كەسێك نوێژ دەكات و بەڕۆژوو دەبێت ماڵی ئاوابێ بۆخۆیەتی ، مەرج نیە خووڕەوشت و مامەڵەی تەواو بێت ، سەفەرو موعامەلە سەنگی مەحەكن .

یەكێك هات شایەتی بدات بۆ كەسێك , عومەری كوڕی خەتتاب لێی پرسی : چۆنی دەناسی ؟ دەترسم هەرئەوەندە بێت كە لەمزگەوتدا بینیوتە , سەفەرو معامەلەتان بەیەكەوە بووە؟؟ وتی: نەخێر ، وتی: دەی كەواتە نایناسی !

بۆیە ئەگەر ویستت هەر مامەڵەو هەڵس و كەوتێ بكەیت لەگەڵ هەركەسێكدا تاتەواو دیراسەی نەكەیت و هەڵی نەسەنگێنی لە سەد لاوە , لێی نزیك مەبەرەوە .

هەتا هەموو (زەماناتێك)ت دەست نەكەوێ پارەی مەدەرێ و سیقەی پێ مەكە , مەگەر خۆشەویست ﷺ نافەرموێ (حوشترەكەت ببەستەرەوە ئنجاپشت بەخوا ببەستە). بۆئەوەی دوایی ئەو كەسە لێت نەبێ بەسوارو تۆش پیادە بەدوایدا ڕابكەی!.



## هی واهەیە بەدینەكەی نان پەیدا دەكات !

زۆر جار لەبەرئەوەی ڕیشمان سپی یە ، یان تەمەنێكمان هەیە لە ئیسلامەتیدا , حەزدەكەین لەهەموو شتێكدا لەپێش بین ، كەئەمەش پێچەوانەی كاری پێشینانە !

دەڵێن پیاو باشێك لەنانەواخانەیەك دەوەستێ ودەیانەوێ پێشی بخەن لەبەرئەوەی گوایە دیندارە , ڕازی نابێت سەرەی كەسی بدەنێ و دەڵێ : من نامەوێ بەدینەكەم بمخەنە پێشەوەو نامەوێ نانی پێ پەیدا بكەم !

## سەواو معامەلە پێویستە!

کاتێك دەتەوێت دۆستێك ئیشێکت بۆ بکات سەواو معامەلەی لەگەڵ بکەی باشترە بۆ هەردوولا ، دۆستێك ویستم ئیشێکم بۆ بکات ، هەرچەند وتم بەچەند بۆم دەکەی خۆی نەدا بە دەستەوەو دەیووت : تۆخەمی ئەوەت نەبێت ، تۆ ئیشی باشت ناوێت .دوایی کە تەواوی کرد نرخێکی داوا کرد کە بەلامەوە زۆر زۆر بوو.

چالەم بەزمانە زۆرن و من نموونەیەك دەڵێم ، ڕەنگە تۆ دە نموونەی ترت لابێ .

خۆزگە بەوەی کە ناخەڵەتی و بەدڵسافی تێناکەوێ , چاك وایە پەندوەرگرین , تالەوە زیاتر ، پێمانەوە نەدەن و داخمان نەکەن ، خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت(لايلدغ المؤمن من جُحْرٍ مّرتين)

بڕوادار لەکونێکەوە دووجار مار پێوەی نادات !!



## پێغەمبەرێکی شارستانی

دووبرادەر لە بەریتانیا لەژوورێکدا کاردەکەن و ئافرەتێکی بەریتانیش لە ژوورەکەدا دەبێت ، هەرکاتێك ئافرەتەکە بچێتە دەرەوە بەیەکەوە بەعەرەبی قسەدەکەن و کە ئافرەتەکەش لەوێ دەبێت بە ئینگلیزی قسە دەکەن . ئافرەتەکەش هەست بەمەدەکات و پرسیاریان لێدەکات کە بۆ وادەکەن ، ئەوانیش دەڵێن : پێغەمبەرەکەمان فەرمانی پێداوین کە سێ کەس بەیەکەوەبوون دوانیان چرپە چرپ نەکەن تا سێیەمیان گومانی بۆ درووست نەبێت .

ئافرەتەکەش وتی :بەڕاستی پێغەمبەرەکەتان شارستانی بووە .پاشان ئەم ڕەفتارە جوانە وای لێکرد موسڵمان ببێت.

بەڕاستی ئایینی پیرۆزی ئیسلام زۆر جەخت دەکاتە سەر ڕەوشت بەرزی و چاکەکاری و خزمەتی خەڵکی و پێزانین ئەوەتا خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت :

( ومن صنعَ إليكم معروفا فكافئُوهُ فإن لم تجدوا ما تُكافئونهُ فادعوا له حتى ترَوا أنكم قد كافأْتموهُ ).

الراوي :عبدالله بن عمر المحدث :النووي :صحيح .

ئەگەر کەسێك چاکەیەکی بەرامبەرکردن ئەوە هەقی بۆ بکەنەوەو پێزان بن ، ئەمەش جۆرێکە لەزەوق و سەلیقە و ڕەوشت بەرزی .

بەکورتی و بەکوردی هەروەك خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت   خوا جوانەو جوانیشی خۆش دەوێت ، جوانی لە جل و بەرگ و پاکوتەمیزی و بۆنی خۆش وهەڵسوکەوت و ڕێزگرتن و میهرەبانی و ڕەوشتی بەرزو خزمەت کردنی خەڵك و خۆنەویستی و ..هتد.

(لا يدخلُ الجنَّةَ من كانَ في قلبِهِ مثقالُ ذرَّةٍ مِن كبرٍ فقالَ رجلٌ : إنَّ الرَّجلَ يحبُّ أن يَكونَ ثوبُهُ حسنًا ونعلُهُ حسنةً ؟ فقالَ   إنَّ اللهَ جميلٌ يحبُّ الجمالَ /الألباني صحيح



## بڵاوکردنەوەی پەیام و بیری ڕەسەن و سەردەمیانە لە ڕێگەی کتێب و نامیلکەوە بۆ سەرجەم توێژەکان

**بەرهەمەکانی پڕۆژە:**

١ـ هاکا ئیسلام گەڕایەوە، (توێژینەوەیەکی کورتە لەسەر داهاتووی ئیسلام) نووسینی ئیکرام کریم.

٢ـ فەرهەنگی بانگخوازان، نووسینی (ئەندازیار عوسمان).

٣ـ بەرەو پەروەردەی ئیسلامی، نووسینی (ئەندازیار عوسمان)

٤ـ ڕامان لە قورئان، نووسینی (ئەندازیار عوسمان).

٥ـ بەخشین لە پێناوی خوادا، نوسینی (عەمر خالید) وەرگێڕانی (روقیە صدیق).

٦ـ ماناى ناوە جوانەکانی خوا، وەرگێڕانی (م. عمر نیظامی).

٧ـ گەڕانەوە لای خوا (سبحانە وتعالی)، نووسینی: عەلی باپیر.

٨ـ نائومێدنەبوون لە سۆز و میهری خوایی، نوسینی ئەحلام حەمەشەریف.

٩ـ بالاپۆشی، ڕێگرەکانی و مەرجەکانی.

١٠ـ بگە بە کاروان، نووسینی عبدالله عەزام، وەرگێڕانی باوکی عبدالرحمن.

١١ـ سەرداری مرۆڤایەتی ﷺ، نووسینی مەلا ئەحمەدی شەریعە.

١٢ـ سەروەرانمان لە مێژوودا، نووسینی د. مصطفى سباعی، وەرگێڕانی روقیە صدیق.

١٣ـ مامۆستاکەم بەم شێوە فێری کردین، نووسینی: د.عائض القرني، وەرگێڕانی: ئامینە صدیق.

١٤ـ تیرۆژێك لـه كەسـایەتی و ڕەوشـتی پێغەمبـەری پێـشەوا (محمد) ﷺ ، ئامادەكردنی: یاسین زەنگەنە.

١٥ـ سـوودەكانی هاوڕێیـەتی پیاوچـاكان، ئامـادەكردنی: حـەمزە بەرزنجی .

١٦ـ تێگەیـشتن و ئیجتهـاد لـه جیهـاددا، نووسـینی: د. عبـدالله عەززام، وەرگێڕانی: هەورامان گەچێنەیی.

١٧. بەرگریكردن له خاكی موسوڵمانان گرنگترین فەریزەی سەرشانی مسوڵمانانە، ن: د. عبدالله عزام. و. ابو صفوان.

١٨ـ یاسـا و ئادابـەكانی تێكۆشـان، نووسـینی د. عبـدالله عززام، وەرگێڕانی م. عبدالهادی عبداللطیف.

١٩ـ منـارەی ونبـوو، نووسـینی: د. عبـدالله عـزام، وەرگێڕانی: كارۆان محمد رەشید.

٢٠ـ چـۆن خەونـەكانت لێك دەدەیتـەوە لـه ژێـر ڕوانگـەی قورئان و سوننەتدا، ن: د. خالیـد علی العنبری . و: كـاروان ڕەشید.

٢١. پەیامێكی دڵسۆزانە ، هیمن عبدالجبار

٢٢ـ كاریگـەریی بیروبـاوەڕ لـه پـەروەردەی نـەوەی نوێـدا، نووسـینی: شـەهید دكتـۆر عبـدالله عـەزام، وەرگێڕانـی: ناصح مەجید ئەحمەد.

٢٢-زەوق و سەلیقە، ئەندازیار عوسمان.

چاوەڕێی چەند بەرهەمێكی نوێمان بن